# تیشکێ لە قورئانەوە

- ٢ -

# کۆمەڵی پایەدار

حبیب محمد سعید

چاپخانەی ئیرشاد - بەغدا

ساڵی/١٤٠٦ك

# پێشکەش

پێشکەش بێت بە قوتابیانی قورئانی پیرۆز ..
ئەوانەی ئامادەن لە بەر رۆشنایی ئایەتەکانی قورئانی
پیرۆزا هەنگاو هەڵگرن .. ژیانیان رێکوپێك کەن ..
هەڵس و کەوتیان بە رەفتاری شیرین و ناوازە
برازێننەوە .. تا مرۆڤایەتیی سەرلێشێواو و
دەستبڕاو بە بۆنەیانەوە لە مەبەستی بانگی پیرۆز تێ
بگا و لە ئەنجاما بیکاتە بەرنامەی ژیانی .. وەتا
ئەوەی خوا ویستی لە سەریەتی لە ئاگری دۆزەخ
رزگار بکرێت و بە بەهەشتی بەرین شاد بێت ..

# پێشەکی

الحمـــد لله رب العالمـــين والصـلاة والسـلام على رسول الله

قورئانی پیرۆز سەرە و خوانی پەروەردگارە کە بۆ ئادمیزادی رەوانـە کـردووە ، تـا کـەڵـك لـەو بەخششە جۆربەجۆرە لـە ژمارە نەهاتوانە وەر بگرێ کـە پێی بەختیوە و سـەرفرازیی هـەردوو جیهانـی دەست کەوێ ..

لێرەدا پێویستی سەرشانی کۆمەڵی ئیماندارە کەوا بـە وردیی لـە قورئانی پیرۆز بکۆڵنـەوە ، بتوانـێ بـە پێی پلـەی بانـگی ئیسلام لێی تێ بگا و بە پێـی پێویستیی ئـەو پلـەیە ، وانە و پەندی لێ وەر بگرێ ..

کۆمەڵی موسڵمانی ئەمڕۆی سەرزەویی پێویستە لـە سـەری زۆر بـە وردیی پەروەردەی خۆی بکا .. ئەویش بـە ئامۆژگاریەکانی خوا و پێغەمبەری خـوا ـ صلى الـه علیـه وسلم ـ ، تـا بزانێ و بتوانێ بـە

چاکترین شێوە ئادەمیزادە سەرلێ شێواوەکان بانگ بکاتەوە بۆ سەر راستە شەقام ..

بۆیە حەزم کرد ماوەیەك لـە خزمەتی ئەم پانزە ئایەتەی کۆتایی سوورەتی « الفرقان » دا بمێنینەوە تـا ببنە رۆشـنکەرەوەی رێگای تاریك و سەخت و پـڕ درك و داڵـی بـەر دەممان کە بـە دەسـتی نـەفامان و دوژمنانی مرۆڤایەتیی دروست کراوە ..

ئیتر کۆمەکیی و یارمـەتیی تەنها لـە خـوا داوا ئەکەین ..

١٤٠١/١٢/١٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى
ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ
يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا
عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا
وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ
ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ
ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ
أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾
إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ
حَسَنَٰتٍ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا
فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟

بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا
عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا
وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ
الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴿٧٥﴾ خَالِدِينَ فِيهَا
حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ
فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ (الفرقان)

ئەم کۆمەڵە ئایەتە باسی هەندێ لە ڕەوشتی بەندە ڕاستەقینەکانی خوا ئەکەن ، ئەو ڕەوشتانەی کە هەموو جم و جوڵێکی پاك و بێ گەرد پیشان بدەن .. تا دەر کەوێ تەنها خواناسان توانیویانە ڕێگای ڕاستی کەلك بەخش بگرنە بەر .. وە لە نێو هەموو چین و بەرەکاندا تەنها ئەمان لە واتای بەرزی مرۆڤایەتیی گەیشتوون .. تا دەرکەوێ خواناسان ـ بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتیی ـ بەری شیرینی هەوڵ و کۆشش و ماندووبوون و ڕەنج و زەحمەت کێشانی پێغەمبەران و هەڵگرانی ڕێبازی پێغەمبەرانن ، تا دڵخۆشیی دەرەوەیان بێت بەرامبەر دوژمنایەتیی و بەربەرەکانێ و یاخیبوون و دڵڕەقیی و پشت وەرگێڕانی دوژمنانی خۆیان و بانگە پیرۆزەکەیان .

لێرەدا کۆمەڵی خواناس بە « عباد الرحمن ـ بەندەکانی خوای خاوەن ڕەحم و میهرەبانیی » دراونەتە قەڵەم .. ئەو خوایەی کە کافران باوەڕیان پێی نیە ..

چونکە خواناسان زۆر بە چاکیی « رەحمان » ئەناسن و ئیمانێکی بێوێنەیان پێی هەیە ، ئینجا بە رەفتارە شیرین و دەروونە پاکەکەیان هەر شیاوی ئەوەن کەوا بەندەی « رەحمان » بن ، وە چونکە خواناســان نموونــەیەکی زیندووی راستەقینەن بۆ ئەو کۆمەڵــەی کە ئیسلام ئەیەوێ بەرپای بکا ، وە بۆ ئەو دەروونانەی کــە بــە پرۆگرامە پەروەردەییە رێك و پێکەکەی پێیان بگەیەنێ .. جا ئەمانەن وا شــیاوی ئەوەن خوای گەورە نرخیان بۆ دانێ و بایــەخیان پێ بدا .. چونکە مرۆڤایەتیی هەمووی بە لای خــواوە هیــچ کێش و نرخێکی نیــە ئەگەر ئەم کۆمەڵە ئیماندارەی تیا نەبوایە کەوا بــەو شێوەی کە خوا پێی خــۆش بێ ملی بەندایەتیی کەچ ئەکەن و لێی ئەپارێنەوە ..

# ڕەوت و گوفتاری موسڵمان

وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾

یەکەم ڕەفتاری شیرینی بەندەکانی خوای خاوەن ڕەحم و میهرەبانیی ڕەوتی نەرم و نیان و لە سەر خۆیە، بە بێ فیز و دەمار و خۆهەڵنان و شانازیی و خۆبادان و لووت بەرزیی .. موسڵمان خاوەنی دەروونێکی هێمن و لە سەرخۆیە و دوورە لە هەرزەیی و لە خۆبایی بوونەوە، بۆیە بە پێویستی نازانێ ڕەوتی خۆی تێک بدا و لاسایی نەفامەکان بکاتەوە .. بە پێویستی نازانێ خۆی هەڵ کێشێ بە سەر هیچ مرۆڤێکا .. بە پێویستی نازانێ ئەو بەخششانەی خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە بکاتە مایەی دڵ ڕەنجاندنی پەروەردگار .

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ خواناسان بە جارێ دەست لە ژیان بشۆن و خۆیان و شێوە و هەندامیان بخەنە پشت گوێ و بە شل و شۆڵیی و ملی شۆڕ و

گەردنی کەچەوە بە لۆژەلۆژ بچن بە رێوە ! ٠

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ موسڵمانان خۆیان بکەنە جێ گاڵتەی کافران و مونافیقان و ئاینەکەیان سووك و رسوا کەن گوایە دەستیان لە دنیا شۆریوە و خەریکی هەوڵ و کۆشش بۆ قیامەت ٠٠ چونکە مسڵمان ئەگەر لە ئەرکی سەرشانی ئاگادار بێ - کە بریتیە لە رماندنی قەڵای ستەمکاران و بەرپاکردنی شارستانییەتێکی پاك و بێگەرد بە پێی فەرمانەکانی ئیسلام ، تا مرۆڤایەتیی لە سەرانسەری سەرزەویدا رزگار بکرێت - ئەزانێ ئەبێ پێشەنگی کاروانی پێشکەوتن و بڵندیی بێت ٠٠ وە ئەزانێ پێویستە لە سەری ژیانی پڕ لە هەوڵ و کۆشش بگرێتە بەر ، نەك ژیانی تەمەڵیی و گۆشەگیریی و دەستپانکردنەوە و کاسەیی کردن بە سەر ئاینەوە ٠٠ بۆیە شەو و رۆژی ژیانی تەرخان ئەکا بۆ هەوڵ و کۆششی بێوچان بە بێ وەستان ٠٠ ئەو کاتە تێ ئەگا موسڵمان کە وەك پێویستە فیز و دەمار لە رەوتیا دەر نەکەوێ پێویستە سستیی و شل و

شۆڵیشی تیا بەدیی نەکرێ ..

ئەوەتا ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان - صلی اللە علیە وسلم - لە بەر دەممانا کە ساتێ سستیی تیا بەدیی ناکرێ .. ژیانێکی پڕ لە هەوڵ و تێکۆشان هەتا لە بەڕێوە رۆیشتنیشیا دەر ئەکەوێ کە بەبێ وچان جیهادی کردووە .. ئەبووهورەیرە - خوا لێی رازیی بێت - باسی ناوچاوی گەشاوەی پێغەمبەر - صلی اللە علیە وسلم - وە گورجیی لە بەڕێوە رۆیشتنا ئەکا کە هاوەڵان ئەوپەڕی هەوڵیان داوە فریای نەکەوتوون کە ئەڵێ :

« ما رأيت شيئا أحسن من رسول الله - صلى الله عليه وسلم - كان الشمس تجري في وجهه ، وما رأيت احدا اسرع في مشيته من رسول الله - صلى الله عليه وسلم - كأنما الارض تطوى له وانا لنجهد أنفسنا وانه لغير مكترث » .

هەروەها عەلیی کوڕی ئەبووطالیب - خوا لێی رازیی بێت - باسی گورج و گۆڵیی و چالاکیی و ئازایەتیی و هیممەتبەرزیی پێغەمبەری نازدار ئەکا

کـە ئەڵێ :

« کان رسـول الله ـ صلی الله علیـه وسلم ـ اذا مشی تکفأ تکفیاً کأنما ینحط من صبب » .

وە ئەوەتا پێغەمبەری نازدارمان ـ صلی الله علیە وسلم ـ باسی پیاوێکی خاوەن فیز و دەمارمان بۆ ئەکا کە جل و بەرگێکی قەشەنگ لە بەر ئەکا و سەری شانە ئەکا و بە لەخۆبایی‌بوون و فیزەوە ئەچێ بە رێوە .. ئا لەو کاتەدا خـوای گـەورە غەزەبی لێ ئەگرێ و زەویی لـە ژێر پێیا دێتـە لـەرزە و ئـەچێ بـە ناخی زەویدا و هەروا لە سەر چوونە خـوار وە بـەردەوام ئەبێ تا رۆژی قیامەت :

عـن أبي هريرة ـ رضي الله عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ قال : « بينما رجل يمشي في حلة تعجبه نفسه ، مرجل رأسه ، يختال في مشيته ، اذ خسف الله به فهو يتجلجل في الارض الى يوم القيامة » . متفق عليه ..

جـا هـەر بە هـۆی ئـەو فیز و دەمـار و

لەخۆبایی‌بوونەوە بوو وا خوای ئەورە قاروونیشی لـە
ناو برد ..

جا کە خواناسان چاویان لە پێغەمبەری ئازیزیـان
بوو و لە ئەرکی سەر شانیان گەیشـتن ، ئـەو کاتـە
بەوپەڕی ویقار و هێمینی و لە سەر خۆوە ژیان ئەدەنە
سەر .. ئەزانن خۆیان بایی چەندن و نەفامە چاوچنۆکە
هەڵپەکەرە دەروونسووکەکانیش بایی چەندێکن ..

ئەو کاتە بە پێویستی نازانن خۆیان خەریك بکەن
و کات و توانایان بە دەمە دەمێ و بەربەرەکانێ لەگەڵ
هەرزە و نەفامەکانا بەرنە سەر ـ بەڵکو خۆیان زۆر لەوە
بە بەرزتر را ئەگرن تا بەزداریی نەفام و سەرکەشەکان
بکـەن :

وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا (٦٣)

کەواتە تا نەفامان بە هەڵە و هەرزەیی بێنە گوفتار
لـە گەڵیانا ئەمان زیاتر لـە سەر ڕەفتاری بەرزی خۆیان
سوورن کەوا خۆیان نەبەنە ریزی ئەوانەوە و لە چاکە
بەولاوە نزیکی وتنی هیـچ خراپەیەك نەکەونـەوە ..

ئەمەش نەك لە بێهێزی و بێدەسەڵاتیانا بێ ، بەڵکو لە خۆ بەرز و بەڕێزگرتنیانایە و ئامادە نەبوونیانە لە بەختکردنی کات و سات و لێهاتنیانا کە بە هیچ شێوەیەك شانی پیاوی خاوەن ڕێز هەڵی ناگرێ و پێویست ناکا خۆی بپەشۆکێنێ بەو شتە بێنرخانەوە ، لە کاتێکا کە کاری گرنگتر و بەڕێزتر و بەرزتری بەدەستەوە بێت کە ئەویش بانگکردنە بۆ لای خوا بەو شێوەی کە خوا خۆی نەخشەی کێشاوە ..

ئا بەم شێوەیە موسڵمان ژیانی ئەڕازێنێتەوە و بە تێگەیشتنی لە ئیسلامی بێگەرد ئەبێتە نموونەی بەرزترین مرۆڤ ..

# شەوکارو پەروەردە

لە ئایەتی پێشەوە ژیانی ڕۆژانەی خواناسـان دەرکەوت کە مایەی شانازییە بۆ ئیسلام ، مرۆڤی ئاژا دەروون‌پاك پەروەردە ئەکات ..

جا با بزانین شەویان چۆن بـە سەر ئەبەن ، لە کاتێکا نەفامان زۆربـەی کـارە ناشیرینە پـڕ لـە نموورەیەکانیان ـ بەرامبەر بە خۆیان و بە کـرۆی ئادەمی ـ هەڵ ئەگرن بۆ تاریکایی شەو .. بۆ ئـەوەی تاریکایی شەو پەردەیەکی ڕەش بێت و بدرێت بە سەر تـاوانـەکانیانـا ..

خواناسان هەروەك ژیای ڕۆژیان جیاواز بوو لـە ژیانی ڕۆژانەی نەفام و هـەرزە و سـەرکەشەکان ، هەروەها ش ژیانی شەویان جیاوازە .

لـە کاتێکا نەفامان لـە ژێر پـەردەی تاریـکایی شەودا خەریکی تاوان و ستەمن .. خواناسانیش ئـەو تاریکییە بـە هەل ئەزانن تـا خۆیـان لە پـەروەردگار نزیك کەنەوە !

لـە کاتێکا بێئاگا و تێنەیشتوان لە خەوی بێئاگاییدا نوقوم بوون و لە مەبەستی ماان و مردنیان شتێکی ئەوتۆ نازانن ، خوا اسان خەریکی خەلوە و خواپەرستین •• خەریکی پاککردنەوەی دەروونیانن •• لەگەڵ پەروەردگارا پەیوەندیان بەهێز ئەکەن ، تا زیاتر چاریان لە دەستی پڕسۆز و بەزەیی خوای خۆیان بێت •• تا زیاتر هەست بە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا بکەن •• تا زیاتر شەرمی لە دڵیانا جێگیر بێ •• وە تا زیاتر ترسی سزای سەختی قیامەتیان لە دڵا بێ ••

وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾

ئا بەم شێوەیە ، شەو ئەبەنە سەر •• بە خواپەرستیی •• بە نوێژ کردن •• بە سەجد بردن و

هەڵسانەوە .. لە تاریکیی شەودا .. لە کاتێکا خەڵکیی خەوتووە .. لە کاتێکا خوای گەورە و رەحمەتی بە لێشاو دێتە سەر زەویی بۆ چاوپۆشیی‌کردن لە تاوانی بەندەکانی .. بە تایبەتیی کە لە سێیەکی شەودا و بە سۆزی خۆی بانگ ئەکاتە بەندەکانی تا هەرکامیـــان حەزی لــە چاوپۆشیی و لێبوردنە با خوا لێی ببورێ ، وە هەر کامیان ئەپاڕێتەوە تا لێی وەرگرێ ، وە هــەر کامیان داوای لێ ئەکا تا پێی ببەخشێ کە ئەفەرموێ :

« هل من مستغفر فاغفر له ؟ من يدعوني فاستجيب له ؟ من يسالني فاعطيه ؟ » .

ئا لەم کاتەدا ـ کە خەڵك وا لە شیرین خـەوا ـ خواناسان روو ئەکەنە پەروەردگار بە گەردنی کەچەوە .. بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە .. بە دڵی هوشیارەوە .. بە بڕیاری لێبڕانی تەواوەوە بۆ جیهاد لە پێنـاوی ئیسلامدا بۆ رزگارکردنی ئادەمیـەکان لـە گومڕایی و سەرکەشیی و لە ئەنجاما رزگاربوونیان لـە ســـزای سەختی دۆزەخ .. روو ئەکەنە پەروەردگار بـە تاك

و تەنیا٠٠ هەڵ ئەستن بەم خواپەرستیی و شەونوێژیەیان لە بەر خاتری خوا بە تاك و تەنیا ٠٠ سەجدەی زەلیلیی و بێ دەسەڵاتیی ئەبەن بۆ خوا بە تاك و تەنیا٠٠ بە دڵ و بە گیان ، بە زمان و کردەوە ، لەو شەوە تاریکەدا ، کە تەنها خوا ئاگادارە ٠٠ ئەیسەلمێنن بەندەی راستەقینەی خوان ٠٠ ئەیسەلمێنن کە ئالای رێبازی پەروەردگاریان لە بەر خوا هەڵ گرتووە ، دوور لە هەموو بەزم و باوێکی دنیایی ٠٠ ئەی سەلمێنن بە تەواویی لەگەڵ خوادا بەینیان بەستووە ٠٠ ئەیسەلمێنن ئەتوانن دەست لە خوێن و گۆشتیان هەڵگرن دوای ئەوەی توانییان دەست لە خەو و حەسانەوەی شەویان هەڵ گرن ٠٠

خواناسان کە مەبەستیان رەزامەندیی خوای میهرەبانە ، پشت لە خەو و حەسانەوەی پڕ تام و لەزەت هەڵ ئەکەن و روو ئەنێن بۆ لای ئەوەی کە زیاتر مایەی حەسانەوەی دەروون و لاشەیە ٠٠ کە زیاتر مایەی وەدەستهێنانی خۆشیی و رابواردنە ٠٠ روو

ئـەنێـن بۆ لای خـــوای پـەروەردگـار تـا روح و ئەندامەکانیان وا بەستەی فەرمانەکانی ئـەو بن و لـە خۆشیی و شادمانیی بێبەش نەبن ..

بەم شێوەیە خواناسان لەو کاتەدا کە خەڵکیی تر خەوتووە ئەمان بێدارن و خەریکی هەڵسان و سەجدە بردنن بۆ رەزامەندیی خوا ، وە لەو کاتەدا خەڵکیی تر چاوی بڕیوەتـە ژیـان و رابواردن و حەســـانەوەی سەرزەویی ئەمان چاویان بڕیوەتە بارەگای خـــوای خـاوەن دەسەڵات ..

خواناسان بەم شەونوێژییەیان ، وە بەم هەڵسانیان و سەجدە بردنەیان ، وە بەم چاوبڕینەیان بۆ رەحمەتی پـەروەردگار و دڵ وابەستەیان بە فەرمانـی خواوە ، دڵەکانیان پڕ ئەبن لـە شەرمی خوا .. پڕ ئەبن لـــە ترسان لە سزای سەختی دۆزەخ بۆیە لە خوا ئەپاڕێنەوە و ئەڵێن : رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾

لـە خوا ئەپارێتەوە تـا لـە سزای دۆزەخ بیـان پارێزێ .. کە سـزایەکی سـەختی پڕ ئێش و ژانە و خراپترین شوێن و مەنزڵە بۆ لەخوایاخیبوان .

ئەمان بە چاوی خۆیان دۆزەخیـان نـەدیوە .. بەڵام ئیمانیان هێناوە بە بوونی و شێوە و شـێوازەکەی دێننە بەرچاویان بە پێی ئەو ناونیشانانەی کە قورئـانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری دڵسۆز ـ صلی اللە علیە وسلم ـ دیاریان کردوون .. بۆیە ترسیان لـە و رۆژە زۆرە و ئەترسن شەرمەزار و سەرشۆڕی ئـەو رۆژە بن .. ئەترسن خەجاڵەتبار بن و سەرگەردانیی ئەو رۆژە سەختەیان بێ بە سەرا .. جا ئەم ترسـە ـ کە بە راستیی جێی خۆیەتی مرۆڤی ژیر ترسی لە دڵا بێ و حیسابێکی وردی بۆ بکا ـ لە راستیدا بەرهـەمی ئـەو ئیمانە قووڵ و بڕوا بتەوەیـە کە دڵـەکانیان پێی رازاوەتەوە .. چونکە چەندێ مـەترسیی زیاتـر لـە دۆزەخ بکرێت ئەوە بەڵگەیە لە سـەر ئیمانی قووڵـی ناوکرۆکی دڵ ..

جا خواناسان له کاتێکا بەم شێوەیە خەریکی خواناسیی و شەونوێژن ، تا لە سزای سەختی دۆزەخ لایان بدا و لێیانی دوور بخاتەوە ، وە نەبێ دڵیان بەو خواپەرستیی و سەجدە و هەڵسانە خۆش کردبێ و بەتەما بن بەوە لە ئاگری دۆزەخ رزگار بن ..

نەء ، دەروونی پاکی پڕ لە شەرم و حەیای ئەوان هەرگیز ناگونجێ شتی وای تێ بخورێ .. چونکە سزای دۆزەخیان بە لاوە سەختە و ئەوەندەش شەرمی بچووکیی و بێدەسەلاتییان لە بەر دەم پەروەردگارا وا لە دڵیانا ، کردەوەی چاك و خواپەرستییان زۆر بە کەم ئەزانن ، ئیتر نایێت بە دڵیانا ئەمە بتوانێ لە ئاگری دۆزەخ رزگاریان بکات .. نایەت بە دڵیانا ئەو خواپەرستیی و چاکەکردنەیان بەس بێ تا لە دادگای رۆژی قیامەتا سەرفراز بن ، ئەگەر بێت و رەحم و سۆز و چاوپۆشیی و لێبووردنی بەلێشاوی پەروەردگاریان نەگاتێ تا لە سزای سەختی دۆزەخ رزگاریان بکات !

لێرەدا تێ ئەگەین ، کە خواناسە ڕاستەقینەکان ـ بە پێی فەرموودەی قورئانی پیرۆز ـ ئەوەندە لە دۆزەخ بترسن، دیارە ئەوە ئەخاتە پێش چاو کە دۆزەخ ڕێ بە هەموو کەسێ ئەگرێ .. دەست ئەداتە یەخەی هەموو مرۆڤێك .. لە بەر دەمیا ئەوەستێت بەڵام لە شێوەیەکی زۆر ترسێنەردا : دەمی دا دڕیوە و ئەیەوێ هەڵی لووشێ .. مرۆڤی تاوانکار قووت بدات .. وە هەردوو دەستی درێژ کردووە و ئەیەوێ باوەش کات بە دوور و نزیکدا .. لە دیمەنێکی ترسێنەردا ئەیەوێ ناوسکی پڕ کات لە مرۆڤ .. هەرچی ـ بە فەرمانی خوا ـ بێتە بەر دەستی !!

خواناسانیش چونکە ئەو دیمەنەیان بە جوانیی ـ بە سەرنجدانی قورئان و فەرموودە ـ دێتە بەر چاو ، بە ڕاستیی لێی ئەترسن .. هەرچەندە کردەوەیان چاکە ، بەڵام زۆر لێی ئەترسن .. بۆیە لە کاتی شەونوێژیدا لە خوا ئەپاڕێنەوە تا لە سزای سەختی یان بپارێزێ و لە یەکیان دوور بخاتەوە و ڕزگاریان کا

لێی و ڕوو بە ڕوو نەبنەوە لە گەڵیا ..

دیارە خواناسەکان زۆر بە وردیی لە سەختیی سزای دۆزەخ گەیشتوون ، بۆیە سامێکی یەکجار گەورەیان لێ نیشتووە ، بە جۆرێک هەموو لەشیان دێتە لەرزە .. ترس و بیم وایان لێ ئەکا لە کاتی پاڕانەوەکەدا بڵێن :

إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا (٦٥)

خوای پەروەردگارمان ، تکامان وایە لە دۆزەخ ڕزگارمان کەی .. بەرتەی سزای ئاگرین ، چونکە هەر کەسێ کەوتە بەری ڕزگاری لێی نابێت .. وازی لێ ناهێنێت و لێی دەستبەردار نابێت ..

إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا (٦٦)

خوای پەروەردگارمان ، بە ڕاستیی دۆزەخ ، شوێن و ماوا و مەنزڵێکی یەکجار خراپ و نالەبارە ، تیایا دەر نابەین .. حەسانەوەی تیا نیە .. شوێنی وەها خراپ نیە و نەبووە ..

شوێنێ کە ئاگر بێت ئەبێ حەسانەوەی لە کوێ و کاتێ بێ ؟!

مرۆڤ لە ناو ئاگرا شەو و رۆژ ئەم دیو و ئەو دیو بکات و چل و پەرگی ئاگر بێت و ئاوی کوڵ بە کوڵ وە یا رۆنی داخکراو خواردنەوەی بێت ئەبێ چۆن بە تەمای حەسانەوە و پشەوودان بێ ؟

خوایە پەنامان بدەیت ..

خوایە گوناەبارین ..

خوایە تاوانبارین ..

خوایە کەمتەرخەمین ..

خوایە خۆت ، بە رەحم و سۆزت ، بگەرە فریامان ..

ئەو تا پێشەوای دڵسۆزمان ـ صلى الله علیه وسلم ـ باسی سزای دۆزەخمان بۆ ئەکات .. نەك باسی هەمووی .. بەڵکو باسی کەمترین پلەی سزای : مرۆڤێکی سەرگەردان ـ خوا پەنامان بدات ـ کە کەمترین و ئاسانترین سزا ئەدرێت .. ئەو پیاوە

سزاکەی لـە چاو سـزای تری دۆزەخـا زۆر زۆر ئاسانە ، لەوە ئاسانتری تیا نیـە ، کە بریتیە لـە دوو پشکۆی ئاگر و ئەخرێنە ژێری سنگی هەردوو پێیەوە، ئـەو دوو پشکۆیە ئەوەندە بە تین و تەووژمن مێشکی ئەهێننە کوڵ ، خۆی وا ئەزانێ سـختترین سـزا ئەدرێت ،، کەچی لە راستیا ئەوە ئاسانترینی سزایە :

عن النعمان بن بشير ـ رضي الله عنهما ـ قال : سمعت رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ يقول : « ان أهون أهل النار عذاباً يوم القيامة لرجل يوضع في أخمص قدميه جمرتان يغلي منهما دماغه ، ما يرى أن أحداً أشد منه عذاباً ، وانه لأهونهم عذابا ! » . متفق عليه ..

بەڵێ موسڵمانە تێگەیشتووەکان چاك سـەختی و مەینەتی دۆزەخیان ئەهێنایە پێش چاوی خۆیان ، بۆیە لـە کاتی شەونوێژییەکانیاندا و لـە کاتی خەڵـوەت و تەنیاییاندا بە کوڵ ئەگریان و فرمێسك لە چاوەکانیان بـە خوڕ ئەهاتە خوار وە .. پێغەمبەری مژدە دەری مژدە ئەدا بەو چاوانە کە لە ترس و شـەرمی خـوادا ئەگرین و ئەسرپین ئـەڕێژن نابێ بـە ئاگـری دۆزەخ

بسووتێن مەگەر شیر بگەڕێتەوە ناو وانی ئاژەڵ کە ئەویش شتێکی رێك نەکەوتووە کە ئەفەرموێ :

« عن ابي هريرة ـ رضي الله عنه ـ قال : قال رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ : « لا يلج النار رجل بكى من خشية الله ، حتى يعود اللبن في الضرع ، ولا يجتمع على عبد غبار في سبيل الله ودخان جهنم » . رواه الترمذي وقال : حديث حسن صحيح ..

بەڵێ ، ئەبووهورەیرە ـ خوا لێی رازی بێ ـ ئەم ئامۆژگاریە بەنرخانەی بیستبوو بۆیە وا خۆی راهێنا بوو لە سەر رۆژوو گرتن بە رۆژا و سێیەکی شەویش شەونوێژی ئەکرد و لە کۆتاییدا ژنەکەی بە خەبەر ئەکردەوە و ئەویش سێیەکی شەو شەو نوێژی ئەکرد و ئەویش کچەکەی هەڵئەساند تا بە شەونوێژی رۆژ بکاتەوە .. بەم شێوەیە ساتێك لە شەو نەبوو ماڵی ئەبووهورەیرە شەونوێژی تیا نەکرێ تا ئەوە بوو خوا کردیە ئەو زانا خزانەیە بەرزە و بووە یەکێ لە مامۆستا بەرزەکانی ئیسلام لە گێڕانەوەی فەرموودەدا..

## مەبەستی بەرز

ناونیشانێکی تری ئەم کۆمەڵە خوانادە بریتییە لە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانێکی تری ئیسلام ، کە ئەویش رازاندنەوەی ژیانیانە بە رێك و پێکیی و مامناوەندیی و مەبەستبەرزیی خەرج و سەرف کردن :

وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾

ئەمانە چاك تێگەیشتوون لەم ژیانە .. ئەزانن ژیان تەنها رابواردن و خواردن و خواردنەوەی دزوت نیە تا بە جارێکا دەست بنێنە ماڵ و سامانیانەوە وە تەنهاش پارە و سامان کۆکردنەوە نیە تا دەستبەرداری هەموو خەرج و مەسرەفێك بن ..

بەڵکو ئیسلامی بێگەرد وەهای تێگەیاندوون کە وا ئەبێ لە چوار چێوەی ئەو پەروەردە و یاسا شیرینەی ئیسلاما ژیان بدەنە سەر کە ئەیەوێ مرسلمانان نە نرخی ژیان و نە نرخی سامان ، لە دەست نەدەن ،

تـا بە شـێوەیەکی مامناوەندیی گونجاو و پێویست سامانیان خەرج بکەن ، ئەمەش هـەمووی بۆ کەڵك و قازانجی ژیانی ئەندامان و کۆمەڵ ..

ئەمانە چاك ئەزانن ئیسـلامی بێگەرد وەك مافی پێ داون لـە سنووری راستیی و دەستپاکیدا کاسپی حەڵاڵ بکەن ، هەروەهاش مافی ئەوەی پێ داون لـە سنوورێکی پەسەند و گونجاوا خەرج وەسرەف بکەن بـە بێ زیادەرەویی و بە بێ رژدیی ..

بـەڵێ ، ئیسـلام نەخشـەی پـەروەردگارە و بەرنامەیەکی رێك و پێـکە بۆ ژیـانی مرۆڤ ، بۆیە ـ هەرچەندە ئیسلام رێگای خاوەنێتیی و موڵکایەتیی تاکیی داوە لە سنووری یاسای ئیسلامدا ـ وازی نەهێناوە ـ وەك یاسا نەفامییەکان ـ هیچ ئەندامێك بە ئارەزووی خۆی دەست بخاتە سامانیەوە و بە رێـگای ناشـەرعیی خەرجی بکات ، وە یا بیشارێتەوە ..

موسڵمان بۆی نیە هەڵس و کەوتی وەك کافران بێت .. بۆی نیە لە هەموو رێگایەکەوە پارە کۆ بکاتەوە

و بۆیشی نیه له هەموو رێگایەکدا خەرجی کات ، چونکه موسڵمان ـ بە پێچەوانەی ئەندامانی وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە کە بە جارێ بەر لا کراون و رێگای خوێن‌مژینیان لێ ناگیرێ ـ بەستراوە بە پاسایەکەوە و ئەبێ لێی نەترازێ .. فەرمانی بە سەرا دراوە پارەی خۆی خەرج بکات لە چوار چێوەی نەخشەی ئیسلامدا، نە ئەوەتا دەست بڵاوی بە کار بێنێ وە نە ئەوەتا رژدیی .. چونکه ئیسلام دان نانێ بە هیچ هەڵوێستێکیانا . لە بەر ئەوەی دەست بڵاویی خراپ‌کاریی و وێران‌کاریی تیایە بۆ دەروون و سامان و کۆمەڵ .. دەروونی مرۆڤ لەوە ئەکەوێ بەرگەی رۆژانی سەخت بگرێ . سامانیش کە بە دەست بڵاویی دەستی تێ خرا و خەمی دوارۆژ نەخورا ئەوا ئابووریی موسڵمانەکان کز ئەبێ و لە تەنگانەدا بەرگەی هیچ ناگرن ، زیاد لەوەی لە ناو کۆمەڵا بەرابەرکێ و دونیاپەرستیی و خۆهەڵکێشان و فیز و ریایی پەرە ئەسێنێ ..

لەو لاشەوە رزدیی و پارەپەرستیی بەندکردنی سامانە لەوەی کە خاوەنەکەی کەڵکی لێ وەر بگرێ .. خۆی و ماڵ و منالی بە ناتەواویی و داماویی ئەمێننەوە و هەمیشە چاویان لە دەستی خەڵك ئەبێ ، لە هەمان کاتا کۆمەڵیش بە شاردنەوەی ئەو سامانە بێبەش ئەبێ . چونکە سامان دەست مایەیەکە پێویستە کۆمەڵ کەڵکی لێ وەرگرێ ..

بەم بۆنەوە دەستبلاویی و رزدیی هەرکامیان بگری ئەبێتە مایەی تێك چوونی باری ئابووریی و کۆمەلایەتیی .. چونکە هەروەك بەندکردنی سامان گیروگرفت بەرپا ئەکات ، هەروەها ئیسراف و دەست بلاویش گیروگرفت بەرپا ئەکات .. ئیتر با نەخۆشیە دەروونیی و رەوشتیەکان بوەستن ..

ئەوەی ئەمڕۆ کەمێ سەرنجی گەلانی رۆژهەلات و رۆژئاوای ناموسلمان بدات ئەمەی بە جوانیی بۆ دەر ئەکەوێ .. لە لایەکەوە ماددەپەرستیی و پارەپەرستیان گەیوەتە رادەیەك بە هەموو رێگایەك پەیدای ئەکەن

ئەگەر چی نامووس‌فرۆشتنیـن بێت ، کەچی ناتوانن دەست‌گرۆیی هەزارێك ، بەڵکو خزمێکی زۆر نزیکیان - وەك دایك و باوك و خوشك و برا - بکەن .. لە هەمان کاتا بۆ بەرەڵایی و ئارەزووی شەیتانیی وە بۆ فێز و دەمار و خۆدەرخستن ئەوپەری دەست بڵاوییان پێوە ئەبینرێت ! .

## ئەمە بەرهەمی پرۆگرامی خێزانەناسییە ! .

بۆیە ئیسلام کە نەیەوێ ئەم کەلێنەی ژیانی مرۆڤ بگرێت ، وە نەیەڵێ لایەنانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و تەندروستیی و رەوشتیی و ویژدانیی برووخێن ئەوەتا بەم شێوەیە چارەسەریی بۆ دا ئەنێ :

لە پێشەوە نەخشە بۆ ژیانی ئەندامان ئەکێشێت تا بزانن چۆن سامان بە کار بێنن و لایەنەکانی ژیانیان بە دەستی خۆیان نەڕووخێنن، بۆیە دوورکەوتنەوەیان لە دەست‌بڵاویی و لە هەمان کاتا لە رژدیی ، بە یەکێ لە ناونیشانەکانی ئیمان ئەژمێرێ کە ئەفەرموێ:

وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾

بەم شێوەیە دەر ئەکەوێ لە بیروهەستی ئیسلامیدا ئیمان نەبەستراوە بە دڵەوە و بەس ، بەڵکو پێویستە لە کۆڕی ژیانا شوێنەواری دیار بێت ..

# سێ دەرمان

ئینجا سێ ناونیشانی تری بەندەکانی خوای خاوەن ڕەحم و میهرەبانیی ئەخاتە پێش چاو کە ئەم ناونیشانانە تەنها لە کۆمەڵی موسڵمانا دێنـە دی ، وە هەرسێکیان دەرمانن بۆ دەردەکانی مرۆڤایەتیی ..

بەڵـێ .. ناونیشـــانەکانی بـەندە خواناسـەکان دەرمانن بۆ زامە بەسـۆکانی ئادەمیزاد تا هـەرکاتێ ویژدانی بزوا و تۆز و خۆڵی نەفامیی بە سەر و چاویەوە تەکان ، ڕوو بکاتە بەرنامەی خوا و خۆی بەرێتە ڕیزی خۆشەویستانی خواوە ..

ئەو سێ ناونیشانانەش بریتین لە هاوەڵدانەنان بۆ خـوای گـەورە و نەڕژاندنی خـوێنی هیچ کەس بـە ناڕەوا ، وە خۆپاراستن لە شەروالپیسیی :

وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ

بەندە خواناسەکان لە بیروباوەڕەکەیان تێی گەیشتوون کە بناغە و بنەڕەتی ناسین و پەرستنی خوای گەورەیە بە تاك و تەنیا ، ئیتر بە هیچ شێوەیەك هاوەڵ بۆ خوا دانانێن .. تەنها ملکەچیی بۆ خوا ئەکەن .. تەنها لە خواوە بەرنامە وەر ئەگرن . شەرم و ترسیان تەنها لە خوایە .. تەنها رەزامەندیی خوایان مەبەستە و کۆمەکیی و یارمەتیی تەنها لە خوا داوا ئەکەن .. چونکە چاك ئەزانن مرۆڤایەتیی کە ئەمڕۆ و هەروو کاتێ سەرگەردان و سەرلێشێواوە، هۆیەکەی نەناسینی خوایە ، وە یا هاوەڵ دانانیەتی بۆی ، وە تاقە چارەسەریش گەڕانەوەیەتی بۆ لای خوا ..

ئەمەش لە بەر ئەوەی بیروباوەڕی خواناسیی بریتیە لە ڕێبازێکی ئاسان و روۆشن و راست و رەوان کە هیچ پێچ و پەنا و شارراوە و لاریی تیا نیە تا مێشك و دەروونی ئادەمیزاد گیر بخوا بە دەستیەوە ، بە پێچەوانەی بیروباوەڕی نەفامییەوە کە بە هیچ شێوەیەك رێز و نرخی تیا نیە بۆ هۆش و ژیریی ئادەمیزاد و بە

لێ کۆڵینەوە و سەرنجدانی ناگاتە ئەنجام .. دیـاره بیروباوەڕی ئاوا ئاڵۆز و گرێ گرێ هەرگیز بە کەڵکی ژیان نایەت ..

ئینجا خۆپاراستنی موسڵمانان لـە ڕژاندنی خوێن ـ جگە بە مافی خۆی و لە پێناوی راستیدا ، ئەویش بە ترازووی شەریعەتی ئیسلام ـ ، دووریانە لە نێــوان ژیانی کۆمەڵایەتیی کە بە شێوەیەکی هێمن و بە بێ وەی بەرێتە سەـر ، وە ژیانی دڕەندە و جـەردە و باخەڵبڕەکان ..

ژیان لـە ناو ئەو کۆمەڵەدا کە قورئان پ ڕوەردەی ئەکا و خوێنڕژانی تیا قەدەغەیە ، ژیانێکە ڕێزی تەواوی تیایە بۆ ئادەمیزاد ، بەڵام لـە سایەی نەفامیدا ژیانـی پێشمە و ئەشکەوت و خوێنڕێژان پێشکەشی ئادەمیزاد ئەکرێ ، وە هیچ کەسێ ناتێ لە خۆی و ماڵ و مناڵ و کەس‌وکار و سامان و کاسپی بێ‌خەم نیە ..

کورتەکەی لە سایەی نەفامیدا نرخێکی ئـەوتۆ بۆ خوێنی مرۆڤ دا نانرێت .. کام شوێنەی زیاتــر

داوای مافی ئادەمیزاد ئەکاو هەمیشە وا بە سەر زاری دایشتوانیەوە ، ئینجا هەموو رۆژێ کۆنگرەی پەنامەکیی ئەبیرێ بۆ کەول کردنی ئدەمیـزاد و رووتاندنەوەی و کردنیە سووتەمەنیی جەنگە بێ ئەنجامە ناهەموارەکان .. وە کـام شـــ وێنەی زیـاتـر داوای ئاشتیی و ئاشتیی‌خوازیی تیا ئەکرێت ، ئینجا بە کۆمەڵ و بێ‌پەروا و بە بێ هۆ ئادەمیزادەکان ئەدرێن لە داو و خوێنیـان ئـەڕژێت .. ئیتر مپرسـە لەو شوێنانەی کە ئالای نۆکەریی کافرانیان بەرز کردۆتەوە !! .

دیسان خۆپاراستنی موسڵمانان لە شەرواڵ‌پیسیی دووڕیانی نێوان ئەو ژیانە پاکەیە کە خوای گـەورە بە بەیاوی ئـەزانێ بۆ ئادەمیزاد ، وە ئـەو ژیانە نزمـە سووکەی کە نەفامان دڵیان بۆی لێ ئەدا ..

ئیسلام کالای شەرەف و ئابرووە بۆ ئادەمیـزاد ، بۆیە موسڵمان شانازیی پێوە ئەکات ئیسلام نەخشـەی شەرەف و ڕێز و داوێن‌پاکیی بۆ بکێشێ .. شـانازیی پێوە ئەکات ئیسلام کۆمەڵـێ بەرپـا بکا کـە هـەموو

ئەندامێکی وەك پێویستە بە تەنگ شەردفی خۆی و کەس و کاریەوە بێت ، وەهاش بەجەنگ شەرەفی هەموو ئادەمیزادێکەوە بێت ••

موسڵمان بە تێگەیشتنی لە ئیسلام ئەم ئاتە ئەم هەستە :

بەیەك گەیشتنی ژن و پیاو پێویستە بۆ مەبەستێکی بەرز بێت •• پێویستە هەوڵی وەدەست هێنانی ژیانێکی پاك و بێ گەرد بدات ، نەك تەنها رابواردنێکی ئاژەلیی ••

پێویستە خزمەتی ژیان بکرێت ، ئەویش بە پەیڕەویی کردنی فەرمانەکانی ئیسلام ، تاچین و و بەرەکانی دواوەش گیرۆدە و بەدبەخت نەبن ••

موسڵمان تێ ئەگا لادان لە نەخشە پاکەکەی ئیسلام بۆ بەیەك گەیشتنی ژن و پیاو ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمانە و زۆریش لەوە خراپتر لە ئادەمیزاد روو ئەدات کە ئەمڕۆ ئەوروپاییەکانی تێ کەوتووە کەوا بە جارێ گیریان بە دەست نەخۆشییە جۆربەجۆرە

جنسیه‌کانه‌وه خواردووه ، که تووشی هه‌موو ئه‌ندام و ئامێرێکی لاشه‌یان بوون و بگره ته‌شه‌نه‌یان کردووه بۆ نه‌وه‌کانیان و مه‌ئه‌ر خوا بزانێ چی تریش له ده‌رد و نه‌گبه‌تیی چاوه‌ڕوانییان ئه‌کات !!

به‌ڵێ ، ئه‌م سێ ناونیشـــانه‌ی پێشـــه‌وه ـ هاوه‌ڵ دانه‌نان بۆ خوا و خـوێن نه‌ڕێژان و زینا نه‌کـردن ـ دووڕیانی نێوان ژیانی به‌رز و به‌ڕێزی ئاده‌میی و ژیانی نزم و سووك و ریسوای ئاژه‌ڵیین •

هه‌رسێکیان جیا که‌ره‌وه‌ی موسڵمان و نه‌فامن •• ده‌ری ئه‌خه‌ن ژیانی موسڵمان له کوێ ـ له به‌رزییدا ـ و ژیانی نه‌فام له کوێ ـ له نزمییدا ـ •

بۆیه خوای گه‌وره ئه‌م سێ ناونیشانه‌ی کردۆته ناونیشانی به‌نده راسته‌قینه به‌رز و به‌ڕێزه‌کانی خۆی ••

جا که ئه‌مه ناونیشانی خۆشه‌ویستانی خوا بێت له وازهێنان لــه هاوه‌ڵدانان بۆ خوا و کوشتن و زیناکردن ، داخۆ لێپرسینه‌وه‌ی ئه‌وانه چۆن بێ که پێیان هــه‌ڵ

ئەستن ؟ قورئانی پیرۆز هەرەشە ئەکات کە هەر کەس بەو کارانە هەڵسێ تووشی سزایەکی سەخت ئەبێ ، ئەفەرموێ :

وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا (٦٨)

ئەوەی هاوەڵ بۆ خوا دا بنێ ، ژیانێکی تاڵ ئەداتە سەر .. هەر رۆژێ بتێك ئەپەرستێ و هەر حەفتەیێ خزمەتی کۆمەڵێ ئەکا .. بە خۆی نازانێ ژیانی لە ملشۆڕیی و نۆکەریدا تەواو ئەکا بێ ئەوەی هیچی دەست کەوتبێ ..

وە ئەوەی کە خەریکی خوێن رشتن بێ ، رشتنی خوێنی ئادەمیەکان بە ناڕەوا ، بە هەر شێوەیەك بیڕێژێ ، سەرەنجام خەجاڵەت و سەرشۆڕ ئەبێت ، خوانەناسەکانی جیهانی تازە چاکترین بەڵگەن لە بەردەستمانا .. هەمویشی بۆ وە دەست هێنانی دنیا ، ناوبانگیی ، کورسیی ، کەچی لە پاڵیانا ناحەسێتەوە و

لــە ئەنجاما بە هەناسە ساردیی سەر ئەنێتەوە ..

وە ئەوەش کە زینا ئەکا ، وە ئەو کۆمەڵەی کـە زینای تیادا بڵاو ئەبێتەوە .. کۆمەڵێکی سووك و ریسوا ئەبێت .. غیرەت نامێنێت .. لە لایەکی ترەوە ئـــەو هەموو نەخۆشیە جینسیانە با بوەستن کە پزیشکەکانیان بــە دەستیانەوە گیریان خواردووە ..

ئەمە تەنها تۆڵەیەکی بچووکـە لە چاو ســزای دووقــاتکراوەی دۆزەخدا ، وە لـە چاو ســووکیی و ریسوایی هەتا هەتایدا :

يُضَاعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا (٩)

ئەوانەی بەم سێ دەردەوە گیرۆدە ئــەبن رێز و بەرزیی ئەم جیهانەیان لە دەست ئەچێ و بە سووکیی و مــەهتووکیەوە تووشــی سزاو نەگبەتیی ئەبن .. لــە قیامەتیشــا ســزای دووقــات و بێنرخیی و ســووك و ریسوایی هەمیشەیی دوای لە کیس چوونی خۆشیی و

رابواردنی بەهەشت بەشیانە ••

بەڵام خوای گەورە خاوەنی بەزەیی و میهرەبانییە •• دەرگای تەوبە و پەشیمانیی و گەڕانەوە بۆ لای هەمیشە لە سەر پشتە •• ماوەی داوە بەوانەی بە تاوان و خراپە هەڵساون و وا پەشیمانن لەو کارانەیان و ئەیانەوێ خۆیان لە سەرشۆڕیی دنیا و قیامەت رزگار کەن ، تا بگەڕێنەوە •• بگەڕێنەوە بۆ سەر ئیمانی راستەقینە و کردەوەی چاك •• بگەڕێنەوە بۆ سەر زێبازی خواناسیی :

إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ

بەڵێ ، هیچ کەس ، لەوانەی بەو سێ کارە خراپە نالەبارە هەڵ ئەسێ ، رزگاری نابێ ، جگە لەوانەی تەوبە ئەکەن و ئیمان بە پەروەردگار ئەهێنن ، وە بۆ ئەوەی رەزامەندیی ئەویان دەست کەوێ بە کردەوەی

چاك هەڵ ئەسن •• بە هەموو چاكەیەك •

ئینجا مژدەیەكی گەورە ئەدا بەوانەی كە دەست لـە خراپە هەڵ ئەگرن و دێنەوە سەر شەقامی خواناسیی كە بریتییە لەوەی :

هەر كەسێ بە پاكیی گەڕایەوە بۆ لای خـوا و دەستی دایە كردەوەی چاكە و هەوڵی تۆشووپێچانەوەی دا بۆ قیامەت ، ئەوا پێش گەڕانەوەی چەند گوناه و تاوان لـە ئەستۆیا بووە هەمووی بۆ ئەگۆڕڕێ بە كردەوەی چاكە ••

ئەمەش هەمووی لە ســـــۆز و بەزەیی خوای میهرەبان •• خوای گەورە ئەوەی پێ خۆشە بەندەكانی بگەڕێنەوە بۆ لای و دەست لە شوێن كەوتنی شـەیتانی گومڕاكەر هـەڵ گرن و خۆیـان لە ئاگـری دۆزەخ بپـارێزن ، بۆیە هەروەك هەموو تاوانـەكانی لـەوە و پێشیان بۆ ئەگۆڕێ بـە چاكە ، هـەروەهـاش لـەوە و دوا بـە هەر چاكەیەك هەڵسن :

فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ

ئەم بەخششە گەورەیە کە ئەڕژێ بە سەر موسڵماندا بەرامبەر بە کردەوەی چاکی نیە ، بەڵکو لە بری هیدایەت وەرگرتن و لە گومڕایی پەشیمان بوونەوەیەتی ..

خوای گەورە بەندەی خۆی زۆر خۆش ئەوێ ، بۆیە زۆری پێ خۆشە ئەویش بگەڕێتەوە بۆ پەنای .. تەنها ئەو بناسێ .. تەنها بە تەمای ئەو بێت .. تەنها لەو داوای کۆمەکیی بکا .. قازانج و زیانی هەر دوو زیان بە دەستی ئەو بزانێ .. تەنها لەو بترسێ و تەنها لەویش شەرم بکا ..

خوای گەورە پێی خۆشە بەندەکەی سەرگەردان نەبێت و شەیتان و دەستە و دایەرەی نەیخەڵەتێنن .. خۆ ئەگەر خەڵەتاندیان و دووریان خستەوە و تاوان و خراپەی زۆریان پێ کرد ، بەڵێنی چاوپۆشیی لێ کردنی

ئەداتێ و هەموو خراپەکانی بۆ بکا بە چاکە ئەگەر گەڕایەوە و پەشیمان بوویەوە :

وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾

ئەوەی پێویستە لامان روون بێ ئەمەیە ئەم ئاینە بێ گەردە بەرنامەی خوایە و خۆی خاوەنێتی و خۆی داڕێژاوە . جا کە خۆیشی بڕیاری داوە هەمیشە دەرگای پەشیمانبوونەوە لە سەر پشتە ، کەواتە هیچ کەس توانای نیە سەرگەردانێکی پەشیمان دەر کا و دووری بخاتەوە .. هەر کەسێ بیەوێ کردەوە و بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ سەر رێگای خواناسیی ، هیچ کەس ناتوانێ بەرگریی لێ بکا .. ئیتر ئەو تەوبەکارە هەر کێ بێ و بە هەر خراپە و تاوانێکیش هەڵسا بێ..

لێرەدا هەڵوێستی وەحشیی کوڕی حەربم دێتەوە یاد ـ خوا لێی رازیی بێت ـ کاتێ لە جەنگی ئوحودا حەمزەی شەهید کرد .. حەمزەی سەرداری شەهیدان و مامە و برای شیریی پێغەمبەری خوا و پاڵەوانی

کۆڵنەدەری ئیسلام ، بە دەستی وەحشیی ـ بە غـەدر و ناپاکیی ـ شەهید ئەبێت ، کەچی پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بۆی نیە و ناتوانێ دەر گای تەوبەی خوا لە رووی وەحشیدا دا بخا و دەری کات٠٠ وەحشیی دێت و موسڵمان ئەبێت !! پاك و بێ گـەردیی بۆ خوا ٠٠ ئاینەکەی زۆر بێگەردە ٠٠

ئەمە پێویستە زۆر بە جـوانیی لای هەڵگرانـی قورئان روون بێت ، هیدایەت و گومڕایی تـەنها بـە دەستی خوایە ، تەوبە و پەشیمانیی وەرگرتنیش هـەر بـە دەستی خوایە ٠٠

ئاگادار بن ، نەکەونە داوی شیرکەوە ٠٠ با بێ خەبیش بن ئاینی خوا بە کەس دەسکاریی ناکرێ و هەر کەسیش بە راستیی دەسـتی نەداتێ خوا لێی زەر ئەگرێتەوە و ئەیسپێرێ بە کەس و کۆمەڵێ راسـت کەن لە گەڵیا ٠٠

وە پێویستە بـە پێی ئەم بەڵێنـەش ئـەو تاوانـە

ـەورەیەی وەحشـیی بێننـە بەرچاو کە سەرداری شەهیدانی شەهید کردووە ، دوای تەوبە و موسـڵمان بوون خوای گـەورە بۆی بگۆڕێ بە چاکـە ٠٠ زیاد لـەوەی بەزداریی کوشـتنی موسەیلەمەی درۆزنیشی کردوە ٠

طەبەرانیی فەرموودەیەکمان ئەخاتە پێش چاو کە بە جزانیی تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەیە ، ئەفەرموێ :

ئەبوو فەڕوە دێتە لای پێغەمبەری خـوا ـ صلی اللـە علیه وسلم ـ و ئەڵێ :

ئایا پیاوێ بە هەموو خراپە و تاوانێك هەڵسێت و لـە هیچ نەپرسێتەوە ، بۆی هەیە تەوبە بکا ؟ واتـە : لێی وەر ئەگیرێت ؟

فەرمووی : ئایا موسڵمان بوویت ؟

وتی : بەڵێ ٠

فەرمووی : « فافعل الخیرات واترك السیئات فیجعلها الله خیرات کلها » ٠٠

فـەرمووی : دەست بکە بـە کردەوەی چاکە و

دەست لە خراپە و تاوان هەڵ گرە ، تا خوا هەموویان بکا بە چاکە بۆت ..

بە سەرسوڕمانەوە پرسی : و غدراتی و فجراتی؟ هەموو تاوان و ستەم و کردەوەی ناپاکی و لاریەك کە پێی هەڵسابم ؟
فەرمووی : بەڵێ ..

ئەوەندەی بە لاوە سەیر بوو ، ئەوەندە مژدەیەکی گەورە بوو خۆی پێ نەگیرا دەستی کرد بە «الله اکبر» وتن هەر خەریکی وتنی بوو تا لە چاو ون بوو ..

بەڵێ ئیسلام مرۆڤ رزگار ئەکا .. مرۆڤی تاوانباویش رزگار ئەکا ، کۆڵی گوناهەکانی لە سەر شانی دا ئەگرێ و کێشانەی ئەکا بە چاکەدا بۆ خاوەنەکەی ، تا تای ترازووی چاکەکانی قورس بێت و لە ئاگری دۆزەخ رزگاری بێت ..

بەڵام پێویستە بزانرێ گەڕانەوە بۆ لای خوا لە ئیسلامدا گۆترەکاریی نیە ، بەڵکو یاسا و مەرجی

خۆی هەیە کە ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەو مەرجانە دەر ئەخا کە ئەفەرموێ :

وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾

بەڵێ ، گەڕانەوە بە پەشیمانیی و دەست‌هەڵگرتن لە تاوان و یاخیی بوون دەست پێ ئەکا •• مرۆڤ هەتا لە قووڵایی دڵیا پەشیمان و ناڕازیی نەبێ لە ژیانی نەفامیی و نەزانیی خۆی وە بە یەکجاریی بڕیاری خۆی نەدا کە وازی لێ بێنێ ، ئەوە هێشتا دەستی پێ نەکردووە •• وە کۆتاییشی بەوە دێت ژیانی بە بەڵگە بێت و بیسەلمێنێ گەڕانەوەکە راستە و کردەوەی چاکە بەرێتە سەر ، ئەو کردەوە چاکەی کە هەڵقوڵاوی دڵ و دەروونە و رووکەش نیە ••

لە لایەکی ترەوە ئەو کەسەی کە ئەگەڕێتەوە ، لەوە و پێش بەو کارە سەلبیانە ژیانی بردۆتە سەر • کە وا بڕیاری داوە وازیان لێ بێنێ ، پێویستە شتێك بخاتە شوێنەکەیانەوە •• نابێ ژیانی بە بۆشیی

بمێنێتەوە .. چونکە یاخیبوون و سەرکەشیی بڕینیە لە کار و جم و جووڵ ، بۆیە پێویستە ، بە کردەوەی چاکە شوێنەکەیان بگیرێتەوە، تا ئەو کەسە لە کار و جم و جووڵ نەکەوێ ، ئەگینا بەتاڵیی و بێکاریی بەرە بەرە دڵی را ئەکێشێتەوە بۆ سەر یاخیبوون و سەرکەشییەکان ..

پێویستە سەرگەرمی ژیانێکی رێك و پێکی وەها بکرێت ، پێویستییە لاشەیی و مێشکیی و دەروونییەکانی تیا بەدی بهێنرێن .. تا رەورەوەی ژیان نەوەستێ و بەو گەڕانەوەیە ئەو کەسە هەردوو جیهانی ئاوەدان بکاتەوە ..

بەڵێ ، ئەوەی گەڕایەوە و دەستی دایە کردەوەی چاك ئەوە بۆ لای خوا گەڕاوەتەوە .. خوای گەورە گەڕانەوەی وەها سوودبەخش و بەکەڵکی ئەوێ تا موسڵمان بڵاوکەرەوەی تۆوی چاکە بێ و هەڵگری نامەی بەختیاریی بێت بۆ سەرانسەری سەرزەویی ..

بەم شێوەیە دەر ئەکەوێ : پرۆگرامێ خوا

نەخشەی بکێشێ چەند گونجاوە لەگەڵ پێداویستەکانی زیانی مرۆڤدا ؟ چونکە بە شارەزایی و ئاگادارییەکی بێسنوورەوە لـە دەروونی مرۆڤـایـەتیی دانراوە ..
پاك و بێ گـەردیی بۆ خوای پـەروەردگار ..
ئەگـەر هـەر خۆی شـارەزا بـێ .. ئاگادار بێ ..
نەخشەرەنگین و کارتەواو بێ !

## زمان پاکیی

جا دوای ئەو رۆشن کردنەوەیە قورئانی پیرۆز دێتەوە سەر باسی ناونیشانی بەرز و بەرێزی « عباد الرحمن » ، کە ئەفەرموێ :

وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾

بەڵێ ، ئەوانەی کە ئیسلام پەروەردەیان ئەکات ئەبێ زۆر رەوشت بەرز بن ، جا شاهێدیی ناڕەوا (زور) ئەتوانین بە دوو واتا لێکی بدەینەوە :

یەکێکیان ئەمەیە کە راستەوخۆ لە وشەکانەوە وەری ئەگرین کە بریتییە لەوەی کۆمەڵی ئیماندار شاهێدیی ناڕەوا و ناحەق نادەن .. شت هەڵ ناگێڕنەوە، وە چاك بە خراپ دەر ناکەن و خراپیش بە چاك نادەنە قەڵەم .. هەوڵ نادەن بە وتەی لووس و بریسکاوە راستیی بگۆڕن. چونکە ئەو شاهێدییە تاوانێکی گەورەیە و یەکێکە لە گوناهە گەورەکان ، و زیانی تیایە بۆ خاوەن ماف و کۆمەکییە بۆ ستەمکار و چەواشە کردنە

بۆ دادگا و مایەی دروستکردنی رق و قین و کینەبازییە لە نێو خەڵکا ..

ئەوەتا قورئانی پیرۆز وەك فەرمان ئەدا بە سەر ئیمانداراا تا لە ژەنگ وژاری بتپەرستیی دڵەکانیان پاك بکەنەوە ، فەرمان ئەدا بە سەریانا تا خۆیان لە وتن و شاهێدیی ناڕەوا بپارێزن کە لە پێش هەموویەوە هاوەڵ دانانە بۆ خوا و ناهەقیی وتنە لە بارەی بیروباوەڕەوە ، کە ئەفەرموێ :

فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ ﴿٣٠﴾ الحج

بەمە شاهێدیی ناڕەوا بووە هاوشانی هاوەڵ دانان بۆ خوا ..

عن ابي بكرة ـ رضي الله عنه ـ قال : قال رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ :

« الا انبئكم بأكبر الكبائر ؟ »

قلنا : بلى يا رسول الله . قال :

« الاشراك بالله ، وعقوق الوالدين » .

وكان متكئاً فجلس ، فقال :

« ألا و قول الزور : وشهادة الزور » .

فما زال يكررها حتى قلنا : ليته سكت ، متفق عليه» .

لەم فەرموودەدا بۆمان دەرئەکەوێ ، کۆمەڵێ لە هاوەڵان ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ وان لە خزمەتی پێغەمبەری خۆشەویستمانا ـ صلى الله عليه وسلم ـ و ئەیەوێ ئامۆژگاریان بکات .. پرسیار ئەکات کە ئایا پێیان خۆشە گەورەترینی گوناهە گەورەکانیان پیشان بدات ؟

ئەوانیش رەزامەندیی و خۆش حاڵیی خۆیان دەر ئەبڕن .

ئەفەرموێ : یەکەم : هاوەڵدانان بۆ خوا و کافر بوون بە هەر شێوەیەك بێت ، وە دووەم : دڵرەنجاندنی دایك و باوك ..

لەم کاتەدا ئەمەی ئەفەرموو شانی دا دا بوو ، لە بەر گرنگیی هەڵسایەوە و رێك دانیشت و سێیەمی

فەرموو کە وتنی شاهێدیی ناڕەوایە ، ئەوەندەی دووبارە

کردەوە ،هەتـا هاوڵان ئاواتیان ئـخواست بێدەنگ بێت ..

پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیە وسـلم ـ زۆر بایەخی ئەدا بە وتن و شاهێدیی ، بە رادەیـەك تاوانی شاهێدیی ناڕەوا لـە ئیسلامدا لە تاوانی زینا و دزیـی گەورەترە ، چونکە وتن ئاسـانە و زۆری پێ ناوێ ، بەڵکو هاندەریشی زۆرە ..

وە واتای دووەمی ئەمەیە بەندە راسـتەقیەکانی خوا ناهانەزێ بە هیچ شـێوەیـەك بەزداریی کۆمەڵ و کۆڕی نەفامیی بکـەن .. ئامـادە نین هەتـا بە بینین و چاوپێکەوتن هیچ جۆرە ناڕەوایەکی نەفامیی ببینن ..

نەفامیی هەموو گیانی شەوورەیی و ستەم و ناڕەوایە بەرامبـەر بە ژیان و بـە کۆمـەڵ .. بۆیە خواناسـان شەرمەزار ئەبن خۆیان تێکەڵی ستەم و لاریی و تاوان بکـەن .. بـە تایبـەتیی ئـەمرۆ : کـۆڕەکانـی ، کۆبوونەوەکانی ، سەیرانگاکانی ، سینەما و مەلهـا و بارەکانـی ، رۆژنامـە و گۆڤـارەکانی ، رادیـۆ و

تەلەفزیۆنەکانی .... هتد ، هەر هەموویان ناڕەوایی پیشان ئەدەن و بڵاو ئەکەنەوە ..

بە رواڵەت راستیی و ماف و نرخ و ریز و پێش کەوتن و حەسانەوە و پشوودانن بۆ مرۆڤ، کەچی لە راستیدا دەست بڕین و خەڵەتاندن و ڕووتاندنەوە و بەرژەوەندیی بازیی و ستەم و ناڕەواز ..

جا کۆمەڵی خواناس هەروەك چاو و ئەندامەکانی پارێزراون لە دینن و بەرداریی هەس و کەوتی نەفامیی ، هەروەها گوێ و زمانیشی پارێزراوە لە وتەی بێ نرخی نەفامان ..

ئەمان زیانیان بۆتە لیتەی گەنیو و دەستیان لە خۆیان بەرداوە ، بۆیە بۆ هیچ نرمیی و ستووکیەك باکیان نیە ، بە تایبەتیی بۆ دەمە دەمێ و وتەی سووك و هەڵبەست و گۆرانیی بێئابڕوانە .. دەستیان لە خۆیان شۆریوە بەو بیاوەوە کە تەمەن دوو رۆژە و با را بوێرن ، جا بۆ ئەمە هەوو رێگایەکی گەیاندن و بڵاوکردنەوە رام کراوە بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستەیان

•• له بەتاڵیا هەر خەریکی دەمە دەمێ و شتی بێ نرخن • بەڵام ڕاستەقینەکانی خوا سەیری ئەو ژیانە پووچەڵەی نەفامان ئەکەن قێزی لێ ئەکەنەوە •• بۆیە بەوپەڕی ڕێزەوە ئەدەن بە لایا و هیچ ئەندامێکیان تێوە ناتلێنن و کاتی پێوە ناکوژن ، چ جای بەژداریی بکەن :

وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا (٧٢)

چونکە لە ڕاستیدا موسڵمان بۆی نیە تەمەنی بە فیڕۆ لە دەست بدات • وە ئەوەندە ئەرك و لێپرسراویی وا لە ئەستۆیا ماوەی نیە تا بە وتەی پڕ و پووچەوە بە سەری بەرێ ، چونکە پێویستە تەمەن و ژیانی تەرخان بکا بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری بیروباوەڕ و بانگەوازەکەی ••

# شەیدای راستیی

وە یەکێ تر لە ناونیشانەکانیان ئەمەیە زوو ئامۆژگاریی ئەبیستن و ئامادەن راستیی ببیستن دوای هەڵسەنگاندن و تاقی کردنەوە وەری بگرن .. شەیدای راستین .. بە بێ ملبادان وەری ئەگرن ، چونکە دڵەکانیان بە رووناکیی قورئان رۆشن بۆتەوە .. پڕن لە ئیمان و وزەی چاکەویستیی :

وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾

ئیمانداران ئەمە نازیشانیانە : هەر کاتێ فەرمایشتی خوایان بخرێتەوە یاد و بدرێت بە گوێیانا ، بە کەڕ و کوێریی ناکەون بە روودا ، بەڵکو چاو و گوێ ساغن و راستیی بە چاکیی ئەبینن و ئەبیستن .. سەربەرز و هوشیار و دادپەروەرن .. بە پێچەوانەی بتپەرستانەوە .. ئەوانەی لووت ئەژەنن بە زەوییدا و

سەرشۆڕ ئەکەنەوە بە سەر بتەکانیانا و چاو و گوێیان لە کار ئەخەن و تەنها شوێن کەوتەی بت و بیروباوەڕە پووچەڵەکانیانن و بە دەست قەست نایانەوێ رێگای راست بدۆزنەوە ..

بۆ ئەوەی چاو و گوێیان بەکارهێنا بێ ، وە بۆ ئەوەی بە زیرەی سەرنجی رێگای هیدایەتیان دا بێ و چاوێ بگێرن بۆ رووناکیی ، هەر خەریکی گاڵە و هاش لووشن بۆ بلاو کردنەوە ـ بکرە بۆ پاراستن ـ ی بیرەکەیان ..

ئەم دیمەنەی بتپەرستان ، دیمەنی سەرشۆڕکردن بە سەر بت و بیروباوەڕی رزیودا ، بە بێ چاو و گوێ ، بە بێ سەرنج و وردبینیی ، دیمەنێکی زۆر سەیرە ، ئەوبەڕی بێ ئاگایی و کوێریی و دەمارگیریی دەرئەخات ، ئەمە ئەو کاتێ دێتە بەر چاومان کە ئێمە سەرنجی دەور و بەرمان بگرین و وردی ئەوانە بینەوە کە سالەهای ساڵە خۆیان و کەسانی تریشیان خەڵەتاندووە و هێشتا بەردەوامیشن لە سەری بە

مەرجێ چاك ئەزانن نە راستی و نە رەوایان بە لاوە نیـە ٠٠ !

خۆیان کەڕ و کوێر ئەکەن و بە دەست قەست دڵیان ناکەنەوە بۆ رووناکیی ئیمان و لە سەر رێبازی زیان بەخشیان هەر بەردەوامن ٠٠

بەڵام خواناسان ، « عباد الرحمن » ، بە پێچەوانەی ئەوانەوەن ٠٠ ئەمان رێگای خۆیان بە چاوساغیی هەڵبژاردووە ، لە کاتێکا نە شارەزای کەڵك و قازانجی رێبازی خزان ، شارەزای زیان و لاریەکانی رێبازی نەفامیشمن ٠٠

ئەزانن راستیی تەنها لە بەرنامەی خواناسیدا دەست ئەکەوێ ، وە فەرموودەکانی خوا هەموویان راستن ، بۆیە بەوپەڕی تێ گەیشتن و چاوساغیەوە ئیمان ئەهێنن و ئەبنە سەربازی ئیسلام ، نەك بە دەمارگیریی کوێرانە و نەك بە لووتژەندن بە زەویدا ٠٠ بۆیە کە بەرگریی لە بیر باوەڕەکەیان ئەکەن و غیرەتیان ئەجووڵێ تا سەر و ماڵیان بکەنە قوربانی ،

ئەوە بە هەڵەشەیی و کوێرانە نیە ، بەڵکو ئەوە غیرەتی
وسڵمانی زانای شارەزانی چاوساغە .. بە دەمارگیریی
دژی نەفامان نـاوەستن ، چونـکە ئەمان هـەڵگری
هیدایەتن ، وە رقیان نیە لە هیچ دەستە و تاقمەیەك ،
تەنها ئاواتیان رزگاریی ئادەمیەکانە لە سزای خـوا ،
بە تایبەتیی سزای قیامەت ..

# پێشەنگی خواناسان

ئینجا بەندە خواناسەکان ئەوەندە خۆشەویستیی خوا و رێبازە شیرینەکەیان بە دلا چووە ، وە ئەوەندە شادمانن وا رێگای سەرفرازیان گرتووە و ـ بە پشتیوانیی خوا ـ لە هەردوو ژیانا رزگار و سەربەرزن، هەر بەوەوە ناوەستن خەریکی خواپەرستیی و شەونوێژیی بن و ئەو هەموو ناونیشانە گەورانەیان پێوە بێ و ژیانی خۆیان و کۆمەڵی ئیمانداریان رازاندبێتەوە، بەڵکو ئاوات ئەخوازن خوای گەورە منال و وەچە و بەرەیەکی ئەوتۆیان پێ ببەخشێ کەوا وەك خۆیان خواناس بن و لە سەر رەویەکەی خۆیان بڕۆن ، هەروەها ژن و خێزانێکی وەهایان پێ ببەخشێ وەك خۆیان روو لە خوا بن و مەبەستی ژیانیان پەرستنی خوا بە تاك و تەنیا و خزمەتکردنی ئاینی خوا بێت ، تا ئەمانیش بە بینینی ئەو ژن و منالەیان چاوەکانیان رۆشن بێ وە و خۆشیی و ئاسوودەیی و شادمانیی بە دلیانەوە بگات .. ئەمەش بۆ ئەوەی یەکەم : ژمارەی بەندە

خواناسەکان زیاتر بێت و ئاینی خوا هەڵگری زۆر بێ و زیاتر لە ئادەمیەکان وزگار بن ، وە دووەم : وەك حەز ئەکەن خۆیان سەرفرازی هەردوو ژیان بن ، وەهاش زن و منداڵەکەیان سەرفرازبن •• وە دیسان لە خوا ئەپاڕێنەوە تا بیان کاتە نموونە و پێشەنگێکی پاك و بێگەرد بۆ ئەوانەی کە شەرم و ترسی خوا لە دڵیاندا :

﴿ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ (٧٤)

بەم شێوەیە خواناسان ئەوەی لە ناو دڵدا پڕ لە ئیمانەکانیاندا شارراوەتەوە دەری ئەخەن •• دەری ئەخەن چ ئاواتێ وا لە دڵیاندا •

پێش هەموو شتێ حەزیان لەوەیە ئادەمیەکان بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگار و لە سزای سەختی دۆزەخ رزگاریان بێت و بەهەشتی بەرینی نەبڕاوەیان لە کیس نەچێ ••

ئینجا حەز ئەکەن ژمارەی خواناسان لە سەر زەویدا زۆر بێ ، بە تایبەتیی ژن و منال ، کە لە بارەی لێپرسراویەوە نزیکترین کەسن و یەکەم سپارد یەکێ من لە گەردنی پیاوەکانا ..

هەروەها پێیان خۆشە خوا ئەوەند، بەخششی خۆی برژێنێ بە سەریانا بینە جێی متمانەی پەروەردگار و ئاینی پیرۆزی بە سپاردە پێیان خەلاتکا و ئادەمیەکان بەرەو خواناسیی بەرن و شوێن هەنگاوە پیرۆزەکانی ئەمان هەڵ گرن ، بۆ دۆزینەوەی رێبازی ئیسلامی پیرۆز .. دیارە ئەمەش هیچ خۆ پەرستیی و بەرزیی و دەسەلاتێکی تیا نیە ، چونکە خواناسە راستەقینەکان هەر کاتێ پێشەوایەتیی و مامۆستایەتیی موسلمانانیان کردبێ بۆ ئەوە نەبووە ژیانی دونیایان دەست کەوێ .. بەلکو تەنها مەبەست رەزامەندیی خوا بووە و کۆمەلی خواناسیش هەموو بە جارێکا بەرەو خۆشەویستیی خوا کەوتۆتە رێ ..

لێرەدا ئەمە ئەخەینە بەرچاوی موسلمانان کە هەر

کاتێ ویستیان خوای گەورە خێزان و منالی خواناسی کۆیڕایەلیان بداتێ ، با بزانن ئەمە ئازاتی مرسلمانە و مافی خۆیانە داوای بکەن و یەکێکە لە ناونیشانەکانی کۆمەلی خواناس ، بەلام ئەوەتا قورئانی پیرۆز لە دوا دوای ناونیشانەکانا باسی کردووە ، وەك بیخاتە بەر چاوی موسلمانەکان و پێیان بفەرموێ : هەنگاو بە هەنگاو بە پەروەردەکردنی خۆتانەوە خەریك بن تا ئەگەنە لای ئەم ئاوات و پاڕانەوەیە .. پەلە مەکەن .. خۆتان چاك کەن ئەوسا خوا پاڕانەوەکەتان لێ وەر ئەگرێ و خێزان و کۆرپەکانتان هیدایەت ئەدرێن و کۆمەلی خواناسیش - بە پشتیوانیی خوا - پەروە ئەستێنێ ..

واتە خەریکی بانگکردن بن .. خۆتان وەها پەروەردە بکەن شایانی پێشەوایەتیی بن ، تا خوای گەورەش ئاواتەکانتان بۆ جێ بە جێ بکات ..

## پاداشتی ئارام

ئینجا دوای ئەو ناونیشانە بەرزانە ، شوێن و ماوا و مەنزڵی بەندەکانی خوای خاوەن رەحم و میهرەبانیی دیاری ئەکرێ :

أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ . . .

ئەو خواناسانە .. ئەو ئیمانداارانە .. ئەو پیاوچاکانە .. لە لایەن پەروەردگاریانەوە پاداشت ئەدرێنەوە بە بەهەشتی رازاوە .. « غرفە » یان پێشکەش ئەکرێت کە یان مەبەست پێی بەهەشتە ، وە یا شوێنێکی تایبەتیە لە بەهەشتا .. شوێنێك کە رێز و پایەیەکی یەکجار زۆری تیا بێ بۆ ئەوانی خاوەن رێز و پایە و پلە بە لای خواوە..میوانداریەکی چاك ئەکرێن.. پێشوازیی ئەکرێن.. چونکە ئەوانی خاوەنی ئەو رەوشت و ناونیشانە بەرزانە کە لە پێشەوە باس کران ، شایانی

ئەوەن بەخێرهاتنیان لێ بکرێ .. لەو شوێنە تایبەتییەدا بە سەلام پێشوازیی ئەکرێن ئەمەش لە پاداشتی ئەوەدا کە لە سەر ئەو رەوشتە بەرزانە ئارامیان گرت.

بەڵێ خۆڕازاندنەوەی کۆمەڵی خواناس بەو کردارە سەر بەرزکەرەوانە ئارامی ئەوێ..بەردەوامیی لە سەر رەوشتی ئیسلامیی دان بەخۆداگرتنی ئەوێ .. ئارام و دان بە خۆداگرتن لە سەر ئارەزواتی دەروون و پاکیشان و دڵفریودانی ژیان . پاڵەپەستۆکان و پاڵ پێوەنەرەکانی نزمبوونەوە بەرەو ژیان و ئامانجی ژیانی ئاژەڵیی ، هەروەها راستوەستان و لە رێلانەدان و ئاوڕنەدانەوە بۆ ئەم لاو ئەو لاوە نەترسان و نەخەڵەتان بە هەڕەشە و بەڵێنی نەفامیی ، هەڵ و کۆششێکی یەکجار گەورەیە و بە ئارام و بەرگەگرتن نەبێ ، کەسێ ناتوانێ وە دەستی بێنێ .. ئەو ئارامەی کە ئەزەندە بە لای خواو گرنگ بێت و بە پێویستی بزانێ موسڵمانان خۆیان پێی برازێننەوە و لە قورئانی پیرۆزا ناوی بێنێ..

جا لە بەرامبەر ئەو دۆزەخەدا کە خواناسان لە

کاتی شەونوێژییەکەیاندا لـە خوا ئەپاڕانەوە تا لایان دالێی و لە سزای سەختی بیان پارێزێ ، چونکە خراپترین شوێن و مەنزڵ و نیشتەجێبوونە ، خوای پەروەردگار بەڵێنیان ئەداتێ پاداشتیان بە بەهەشت بداتەوە :

خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾

ئیتر کە چوونە ناو بەهەشتە رازاوەوە ، بە ویستی خوا نەبێ تیایا نایێنە دەرەوە ، وە لـە چاکترین شێوەی دامەرزان و نیشتەجێبووندا ژیان ئەدەنە سەر ..

# ڕێزی خواناسان

جا دوای ئەوەی نەخشە و وێنەی ڕەوشتی بەندەکانی خوای خاوەن ڕەحم و میهرەبانیی خستە پێش‌چاوان ، وێنەی ئەو مرۆڤە بەرێزانەی کە پاڵفتە و هەڵبژاردەی هەموو مرۆڤایەتیی بوون ، ئەم ئایەتە پیرۆزە کۆتایی دێ و تیایا دەری ئەخا کە مرۆڤایەتیی هەمووی چەند بێ‌نرخ و بێ‌بایەخە لە ترازووی خودادا ئەگەر ئەم بەرێزە ڕەوشت بەرزانەی تیا هەڵ نەکەوتایە ، کە چاویان بڕیوەتە ئاسمان و نزا و لاڵەیانە پەروەردگاری میهرەبان ڕەحم و سۆزی بە لێشاوی برژێنێ بە سەریانا و چاوپۆشیان لێ بکات ..

لە بەر ڕێزی ئەو خواناسانە نەبوایە ، مرۆڤایەتیی لە ترازووی خوادا هیچ سەنگ و کێشانە یەکی نەئەبوو، تا ئەمە دڵخۆش کەر بێ بۆ هەڵگرانی ئایینی خوا و بزانن لە ترازووی خوادا چەند سەنگینن و لە هەمان کاتا ئەوانەی ملێ پا ئەدەن و باوەڕیان بە ڕێبازی خواناسیی و

زیندووبوونەوە نیە، ؛ وانە بە مسۆگەریی سزا ـ سەختی شیاوی خۆیان ئەچێژن :

قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾

خوای گەورە فەرمان ئەدا بە سەر پێغەمبەری خۆشەویستا ـ صلى الله عليه وسلم ـ تا بفەرموێ :

ئەی ئیمانداران ! ئەگەر پاڕانەوە و خواپەرستیی و ملکەچیی ئێوە نەبێت ، پەروەردگارم هیچ بایەخێکتان پێ نادات . وە ئەی بێبڕوایان ئێوەیش کە دژ ـ خوا و ڕێبازەکەی ئەجووڵێنەوە چاک بزانن لە سزای سەختی خوا ڕزگار نابن .. هەر ؛ بێ بیچێژن ..

ئەم ئایەتەی کۆتایی زۆر جێی خۆشیی تا گونجاو و شیاو بێت بۆ ڕۆشن کردنەوە و ڕازاندنەوەی هەموو سەربڵەکانی سوورەتەکە و بە تایبەتیی ئەم باسەی کۆتایی کە باسی ڕەوشتی بەندەکانی خوای خاوەن ڕەحم

و میهرەبانیە ، تا هەڵگرانی ئاڵای خواناسی بە هیچ شێوەیەك دەستبەرداری رێبازی شیرینیان نەبن و نرخی خۆیشیان و دوژمنانیشیان لە ترازووی خوادا بۆ دەرکەوێ ..

لە هەمان کاتا دڵخۆشیە بۆ پێغەمبەری پێشەوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە کاتێکا کە بانگی پیرۆزی وا لە مەککەدا و موسلمانەکان بێ دەسەڵاتن و کافرانیش بە هەموو شێوەیەك ئازاری دڵ و مێشك و لاشەی پێغەمبەری خوا ئەدەن و حورمەت و ئابڕوو و ریزدان و جوامێریی و وەفا و پەیوەندیی خزمایەتیی ئەخەنە ئەولاوە و ئەوپەڕی دەمدرێژیی لە خزمەتیا ئەکەن ، کە خۆیان لە هەموو کەسێ زیاتر پایە و پلەی بەرز و رەوشتی پاك و فیطرەی بێگەردیان ئەناسیی ، بەڵام تەنها بۆ بەرگریی لە دار و بەردێکی رەق و تەق و بیروباوەڕێکی گەنیوی رزیوی صەدان ساڵان ، بەو هەموو دژایەتیی و ملپێچیە هەڵ ئەسان ..

جا ئەبێ قورەیش چی بێت ، وە یا مرۆڤایەتیی

هەر هەمووی چی بێت ، ئەگەر لە بەر خاتری ئەو کۆمەڵە کەمە ئیمانداره نەبێ کە هاوار لە خوا ئەکەن و بە گەرمیی لێی ئەپاڕێنەوە ..

ئەبێ ئەو داماوانە کامە و چی بن ؟

کامە بێ هێزیان ؟

کامە بێ دەسەڵاتیان ؟

خۆ ئەوی زەویی کە هەموو مرۆڤایەیی بە سەریەوە ئەژی تاکە زەڕڕەیەکە لە بۆشایی بوونەوەری فراوان و پان و پۆڕدا .. ئینجا مرۆڤایەتیی بە تێکڕا هەر هەمووی بریتییە لە تاقە جۆرێك لە جۆری ئەو گیاندارە زۆر و زەبەندانەی کە بە سەر رووی زەویەوە ئەژین ، وە هەر میللەتێکیش یەکێکە لە میللەتانی سەر زەویی ، ئینجا هەر بەرەیەکیش لە هەر میللەتێك بریتییە لە لاپەڕەیەك لە لاپەڕەکانی بەڕاوێك ـ لە چاو تەمەنی ئەو میللەتەدا ـ کە مەگەر تەنها خوای گەورە خۆی ژمارەیان بزانێ ..

بەڵام کە ئادەمیزاد لە سنوور دەر چوو و شوێنی

خۆی و پلەی لەدەست دا و لە بەر ڕۆشنایی ڕاستەقینەدا هەنگاوی هەڵ نەگرت ، خۆی گیف ئەکاتەوە .. لە خۆی بایی ئەبێ ، وە بە کەمێ زانیاری وە یا کەمێ پێش کەوتن و بە دەستهێنانی ژیانی دنیا وا ئەزانێ هیچی نەهێشتۆتەوە .. بۆیە دەست ئەداتە هەڵس و کەوتی هەڵەشە و پەڵەشە و دەمدرێژیی و سنگ‌دەرپەڕاندن و مانازیی بەو زیریی و سەلیقەوە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە ..

ئیتر لە بیری ئەچێتەوە پێشینەکان وەك ئەو کە لە خۆیان بایی ئەبوون و لە خواناسیی پشتیان هەڵ ئەکرد لە چاو ئەمڕۆدا وەك ئەوە وایە هیچیان نەزانیبێ و لێ نەهاتبێ .. دەنا کە واتە هەرچی شتێ ئەمڕۆ هەیە و ئادەمیزاد بە دەستی هێناوە ، لە چاو دواڕۆژا هیچی تیا بەستە نیەو لە خۆبایی بوون شتێکی زیادە ، سەرەڕای ئەوەیش کە سپڵەیی و بەدنمەکیی دەر ئەخا لە بەردەم پەروەردگاری خاوەن بەخشندا ..

وه له بیری ئەچێتەوه که چەند دەستەپاچه و هیچ لێ نەهاتووه له کاتی لێقەوماندا .. له کاتی داماویدا له کاتی نەخۆشیی و هەژاریی و ترس و لەرزدا ..
چەند بێوزەیه .. چۆن کەس ناتاته فریای .. ئەگەر بێت و ملکەچیی بۆ خوا نەکا و پەیوەندیی پێوه نەکا و هێز و سەبیقه و ژیریی لێوه وەر نەگرێ .. وه ئەگەر بێت و نەیەتەوه سەر راستەشەقامی خواناسیی ، تا له ترازووی خوادا دیار بێت و کێش و قورسیەکی پێ بدرێ ..

وه له بیری ئەچێتەوه مرۆڤ ئەگەر خواناس بێت چەندە بە لای خواوه بەرێزه ، تا رادەیەك خوای گەوره فەرمان ئەدات به سەر فریشتەکانیا ـ که به هیچ شێوەیەك له خوا یاخیی نابن و تاوان ناکەن ـ تا سەجدەی بۆ بەرن ، که ئەمەش ئەوه ئەگەیەنێ له ترازووی خوادا فریشته قورس و سەنگینتره ..
وه له بیری ئەچێتەوه که ئەم رێز و پایەپێدانەی خوای گەوره بۆ ئەو که بریتییه له سەجدەبردنی فریشته

بۆی ، بۆ ئەوەیە پەروەردگاری بە چاکیی بناسێ و پەیوەندیی پێوە نەبڕێ و لە قووڵایی دڵیەوە بیپەرستێ .. تا پاریزگاریی ئەو خاسیەتانە بکا کە بەبۆنەیانەوە فریشتە سەجدەی بۆ بردووە ، ئەگینا کە لەوە ترازا ئیتر نە سەنگی هەیە و نە دیارە و نە پایەی هەیە ..

قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ

جا کە دەری ئەبڕێ خوانەناسان لە ترازووی خوادا هیچ سەنگێکیان نیە ، ئەوپەڕی دڵخۆشیی و پشت گیریە بۆ پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ:
ئەی خۆشەویستمان ، بەو کافرە سەرگەردانانە بڵێ :

مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي

من وام لە پەنای پەروەردگارما .. هێزێکی یەکجار بەدەسەڵاتی هەیە و پاڵم پێوە داوە.. ئەو پەروەردگارمە

و منیش بەندەیم •• جا ئێوەی داماو و سەرگەردان کـە دوورن لە ڕۆشنایی ئیمانەوە و لە تامی ژیانی کۆمەڵـی ئیماندار بێ بەشن و لە نەفامیی و نەزانیندا ئەگەوزێنەوە، ئەبێ چی بن ؟

﴿فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾ (٧٧)

جـا وا ئـەوەندە نەکبـەتن بڕواتان بـە ڕێبازی شـیرین نەکـرد و لـە سـەر نەفامیی خۆتـان هـەر بەردەوامن ، تا سزای دۆزەخ بۆ خۆتان مسۆگەر کەن ••

لە کۆتاییدا ، لە خوای گەورە ئەپاڕێمەوە بە سۆز و بەزەیی خۆی بمانخاتە سەر ئەو ڕەوشت و کردارە جوانانەی کە ڕەزامەندیی خـۆیمان دەسـت ئەخەن و سەرفرازی ڕۆژی قیامەت بین ••

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين ••

# ناوەرۆك

# ئەم نامیلکەیە

چمکێ لە رەوشتی بەرزی بەندەکانی خوای خاوەن رەحم و میهرەبانیی ئەخاتە پێش چاو ، ئەو رەوشتانەی کە قورئانی پیرۆز بە نیاوی کۆمەڵی هەڵبژاردەی گرۆی ئادەمیان بزانێ ، وەك پێیان بفەرموێ : ئەگەر رەزامەندیی خوا و بەندایەتیی راستەقینەتان ئەوێ ئەمە بەشێکە لەو رەوشتانەی کە پێویستە خۆتان پێیان برازێننەوە تا شایان بن خوای گەورە کۆمەکیتان بکا و لە سایەی ئاینەکەیا بحەسێنەوە ..

نرخی (٣٥٠) فلسە